

# چەند سەرنجێك لەسەر ڕووخساریەت

## ژیل دۆلۆز
## فێلیکس گواتاری

عەلی ئەحمەد

# چەند سەرنجێك لەسەر ڕووخساریەت

## (ژیل دۆلۆز و فیلێکس گواتاری بە نموونە)

عەلی ئەحمەد

٢٠٢٣

چەند سەرنجێک لەسەر ڕووخساریەت

(ژیل دۆڵۆز و فیلێکس گواتاری بە نموونە)

(پەڕتووکی دووەم لە زنجیرەی: چەند پرسێکی گرینگی سەردەم)

_-_-_-_-_-_-_-_-_

نووسەر : عەلی ئەحمەد

دیزاینی بەرگ : عبدالله ساڵح

بابەت : فیکری

ساڵی چاپ : ٢٠٢٣ – یەکەم

_-_-_-_-_-_-_-_-_-_-_

## پێشکەش

پێشکەشە بە هەموو بازنە

مەعریفی،فەلسەفی،زانستی،عیرفانییەکانی کورد-زمان.

# سوپاس و پێزانین

بۆ هەموو ئەوانەی لە چاپکردن و ڕێکخستنەوە و

پێشنیارەکانی ئەم کتێبەدا بەشدار بوون.

تاکە حیکمەتی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بزانیت هیچ نازانیت.

# ناوەڕۆک

# دەروازە

جەختکردنەوەمان لەسەر پرسی ڕووخسار، پابەندە بە هەبوونی ئەو دەسەڵاتە کۆمەڵایەتی و فرەڕەهەندەی کە ڕووخسارێک هەیەتی لە کۆمەڵگا و جڤاکێکدا. ڕووخسار هەر تەنها بەشێکی فیزیکی سەر ڕووی جەستەیەکی مرۆڤ نییە. بەڵکوو خاوەنی چەندین چین و توێژی ڕامیاری و کۆمەڵایەتییە. ئەم جەختکردنەوەیەی مرۆڤایەتی لەسەر ڕووخسار، لە هەموو کاتێک زیاتر تۆغ بووە ...

ڕووخسار لە پێش مۆدێرنیتەدا تەنها لەناو بابەتە هونەرییەکانەوە جەختی لەسەر دەکرایەوە. بەڵام لە ئێستادا ڕووخسار لە هەموو لایەنێکی کۆمەڵگاوە جەختی لەسەر دەکرێتەوە. هەروەکوو ئەو بەرنامە نێودەوڵەتییانەی

کە بە هەڵبژاردنی شاجوان ناسراون؛ کە ڕووخسارێکی جوانتر لە ئەوانی دیکە هەڵدەبژێرن و دەیکەن بە پێوەرێک بۆ ئەوەکانی دیکە. لێرەدا ئێمە خۆمان لەبەردەم ڕووخسارێکی ڕەهای داگیرکەردا دەبینینەوە. کە لە پێشیدا بێدەسەڵاتین و لاوازین.

پرسی ڕووخسار بە تایبەتتر لەناو بازنەکانی [پەرەپێدانی خودی] و چاککردنەوەی دەموچاو و ئەوەی بە ماکسکردنی ڕووخسار ناسراوە [١] بەربڵاوە. لەناو ئەم بازنە سەپێندراوانەدا، دەبێت تاک زیاتر سەرنج لەسەر بەهێزکردنی لایەنە جوانییەکانی ڕووخساری بدات. وە دەرکەوتەکانی ئەم دەستکاریکردنە گرینگ نین. بەڵکوو گرینگ ئەوەیە لە ڕووخساردا لە ڕێزی پێشەوە بێت.

جوانی ڕووخسار پابەندە بە هەبوونی دەسەڵات و ڕێـژەی هێزێـک لـە ڕووخسـارێکدا. ڕووخسـاری بـەجوان ناسـراو و بـەجوان دانـدراو، لـە ڕووی پۆلێنبەنـدی هـێز و دەســەڵاتەکانەوە، لــە ڕیــزی پێشــەوەدایە. وە لــە کۆتایــدا جوانییەکانیش دەبن بە کەرسـتەیەک بـۆ دەسـەڵات و هـێزی کۆمەڵایەتی.

پرسـی ڕووخسـار لـە سـەدەی بیسـت و یەکـدا خاوەنی چەنـدین مشـتومڕ و دیبەیتـە. لـێرەدا هـەوڵ دەدەین خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ پرسی ڕووخسار بخەینە ڕوو. وە ئامــاژە بــە چەنــد فەیلەســووفێک بکــەین لــە پــای ڕووخسـاردا. وە لـە کۆتاییـدا هـەوڵ دەدەم تێڕوانیـنی خـۆم لەم بارەیەوە بخەمە ڕوو.

لە ڕاستیدا هێنانەوەی دوو فەیلەسووفی وەکـوو ژیل دۆلۆز و فیلێکس گواتاری بۆ ناو ئەم پرسـە، بێجگـە لـە

ئاگادارکردنەوەیــەک بــۆ خوێنــەر کــە ئــەم بابەتــە لــە ڕابردووشدا جـەختی لەسـەر کراوەتـەوە، هیچی دیکـە نییـە. چونکــە مــەرج نییــە گوتارەکــانی ژیــل دۆلــۆز و فیلیکس گواتاری ئەوەندە ڕاستیش بن. بەڵام ئەوان هەوڵی خۆیان لە پای شیکردنەوەی دۆخەکە داوە. کە چـل و سـێ سـاڵ پێش ئێســتا و لــە پــاش بڵاوکردنــەوەی پــەڕتووکی هــەزار ڕووتەختدا، مەزندەی ئەو دۆخەیان کردووە کە لە ئـەنجامی ئاڵوودەبوون بە ڕووخسار و میکانیزمـەکانی ڕووخسـارەوە بــەرپا دەبێت. کــە لــە ئێســتادا یەکێکــە لــە نیشــانەکانی نەخۆشییەکانی [٢] کۆمەڵگاکەمان و کۆمەڵگاکانی دیکەش بە گشتی.

لە کۆتاییدا دەمـەوێت خوێنـەر ئاگـادار بکەمـەوە کە ئەم پرسـە زۆر بابـەتی دیکـە لـە خـۆ دەگرێت. هیـوادارم ئــەم پەڕتووکــە وەکــوو دەســتپێکێک بێت بــۆ باســکردن و گرینگیدان بەم پرسە لە کۆمەڵگا و بازنەکانی دیکەدا ...

هەموو شتێک جوانی خۆی هەیـە، بـەڵام هـەموو کەسێک نایبینێت.

– کۆنفۆشیۆس

# ژیل دۆلۆز و فیلێکس گواتاری



پێش ئەوەی بچینە سەر پرسی ڕووخسار لەلای هەردوو فەیلەسووفی فەڕەنسی، سەرەتا پێویستە پرسیارێکی سەرەکی بورووژێنین: ئایە پێویستە بچینەوە سەر ئەم دوو فەیلەسووفە لە ساڵی (٢٠٢٣) و گەڕانەوەیەک بکەین لەبۆ سەدەی بیست؟ ... لێرەدا تەنها دەتوانم بڵێم ئەم گەڕانەوەیە تەنها لەبەر ئەوە گرینگە لەبۆ ئەوەی بیسەلمێنین

که ئەم پرسەی لەم بەشەدا دەیورووژێنین پرسێکی تازە نییە و بەڵکوو هەر لە کۆن و دێرزەمانەوە باسی لێ کراوە.

کەواتا، لەبۆ ئێمە، گەڕانەوەمان بۆ سەر ئەم دوو فەیلەسووفە، لە ڕاستیدا بریتی نییە لە بەرزڕاگرتنیان و بەهەند زانینیان. چونکە ئەم دوو فەیلەسووفە لە رووی نووسینەوە گەلێک ئاڵۆزن و تەنانەت زۆرجاریش لەلایەن نەیارەکانیانەوە بە جەنجاڵ و سۆفیستاییش ناوەزەند کراون. بەڵام هەر چۆنێک بێت، لێرەدا بە پێویستمان زانی تیشک بخەینە سەر بۆچوونیان سەبارەت بە ڕووخساریەت. وەکوو بەڵگەیەک کە بەڵێ، لە ڕەوەندی مێژوویی فەلسەفەدا پرسێک هەبووە بە ناوی ڕووخساریەت و دەرکەوتەکانی.

ڕووخساریەت بریتییە لە درووستبوونی

ڕووخسار وەک چینێک، ڕووبەرێک،

پیستەیەک، دیوارێک، ماسکێک، بە شێوەیەک
کە سیفاتی جیاواز بۆ تاکێک دیاری دەکات.
ڕووخساریەت ئامێرێکە سیفەت و فۆڕمەکان
کۆ دەکاتەوە. [١]

هەردوو تیۆریسیەنی فەڕەنسی: ژیل دۆلۆز و فیلێکس گواتاری لە پەڕتووکی <هەزار ڕووتەخت> [A Thousand Plateaus: Capitalism and Schizophrenia] چەمکی "ڕووخساریەت"یان ورووژاندووە و کاریان لەسەر کردووە. لێرەدا هەوڵ دەدەین هەندێک لە پرسەکانیان سەبارەت بە ڕووخسار بورووژێنین و شییان بکەینەوە.

ڕووخساریەت فۆڕمێکی دەسەڵاتە کە لە
ڕێگەی درووستکردنی کاتیگۆرییەکان و

ســـــەپاندنی نۆڕمەکانـــــەوە کـــار دەکـــات. سـووژەکان بەرهـەم دەهێـنێت و جەسـتەکان دەخاتــــــە ژێردەســــــــتەی سیســــــــتەمێکی کۆنترۆڵکردن. [٢]

لێرەدا مەبەستی دۆلۆز و گواتاری ئەوەیە کـەوا ڕووخسارەکان پابەندن بە گشتگیرییە باوەکان و، ئـەو بـەها باوانەی کە لەناو کۆمەڵگایەکدا بوونیان هەیە. وە پاشان ئەم ڕووخسارانە تاکەکـەس و خـود و سـووژە بەرهـەم دەهێنن. وە پاشـان جەسـتە بـە گشـتی دەخزێنـنە نـاو سیسـتەمێکی کۆنـترۆڵکردن و داخـراو. لـێرەدا لـەلای دۆلـۆز و گواتـاری، ڕووخســـار خـــاوەنی دەســـەڵاتێکی داگیرکارانەیـــە و هـــەوڵ دەدات تاکەکانی دیکە داگیر بکات بە هۆی بـەکارهێنانی ئـەو هـێزەی هەیـەتی. کـە دەکـرێت بـە جـوانی و جـوانی بـاوی کۆمەڵگایەک ناوەزەندی بکەین.

ڕووخساریەت بە هەمان شێوەی زمان کار دەکات. بە دیاریکردنی ناسنامە و مانا جێگیرکراوەکان. ڕووخساریەت کۆدێکە کە جەستە ڕێک دەخات و کۆنترۆڵی دەکات. [٣]

بۆ دۆلۆز و گواتاری ڕووخسار هەر تەنها فۆرمێکی جەستە و شێوەیەکی ئێستاتیکی نییە. بەڵکوو خاوەنی هێزی جێبەجێکردنی ناسنامە و ماناکانە لە کۆمەڵگایەکدا. بۆ دۆلۆز و گواتاری، ڕووخسار وەکوو کۆد و پەیڕەوێکە کە ڕووبەرێکی کۆمەڵایەتی بەرفراوان کۆنترۆڵ دەکات و هەوڵ دەدات ڕێکخستەوەی خۆی بەسەر ڕووبەرە کۆمەڵایەتییەکەدا بسەپێنێت. بۆ دۆلۆز و گواتاری؛ ڕووخسار ڕامیاریانەیە. [٤]

ئێمە سەرنجمان لەسەر کارەساتەکانی داهاتوو چڕ دەکەینەوە، لە کاتێکدا کارەساتە ڕاستەقینەکان لە پێشماندان، لە ژێر لووتماندا، و لەگەڵ لاوازبوونی کردە کۆمەڵایەتییەکان.

– فێلیکس گواتاری

## شیکردنەوەی زیاتر

ئەگەر ئێمە وێنە و شێوەی ڕووخسارێک سادە بکەینەوە لەبۆ سەرەکیترین باری خۆی. ئەوا دەبینین پێک هاتووە لە ڕووکارێک کە وەک دیوار وایە. ئەمەش دەموچاوە بە گشتی. وە کونەکانی دیوارەکەش بریتین لە تێچوونەکان [Input] [١] . ئەم تێچوونانەش دەم و چاو و گوێ و هەموو ئەو ئەندامانە دەگرنەوە کە بەشدارن لە بەجێ گەیاندنی کردەیەکی تێچوونانە.

وە کاتێک زانیارییەک فڕێ دەدرێتە سەر ڕووی دیوارەکە، هەندێکیان هەڵدەپەڕن و هەندێکی دیکەش دەکەونە ناو کونەکانەوە و دیوارەکە دەشکێنن. ئەمەش سیستەمێک، یان ئامێرێک درووست دەکات کە تیایدا ئاڵوگۆڕ و جووڵە پەیدا دەبن.

وه دۆلۆز و گواتاری پێیان وابوو ئـەم ئامێرانـە سیستەمی نیشانەناسی/مانازانی [Semiotic Systems] [ ٢] جیاواز و پێکهاتەی جیاوازی تایبەت بە خۆیـان هەیـە کـە هاوشێوەی ئامێرێک وان. وە دەتوانن یـەک بگـرن و ئـامێری گەورەتر و تۆکمەتر درووست بکەن.

دۆلـۆز و گواتـاری ڕوونی دەکەنـەوە کـە ئـەم جـۆرە جیاوازانـەی سیسـتەمی نیشانەناسـی لـە بەرامبـەر یەکتریدا کێبڕکێ دەکەن لەبۆ باڵادەستی و دەسەڵات. [٣]

کەواتا، هەر لە سەرەتاوە پرسەکە پەیوەندی بـە جموجـۆڵی هێزەکـان و دەسـەڵاتەکان بـووە لـە ڕێگـەی بـــەکارهێنانی ئامرازەکـــانی جـــوانی [Aesthetic Exploitation] [4]

ئامێر لەگەڵ ئامێر دەئاخڤێت پێش ئەوەی لەگەڵ مرۆڤ بێت.

– فێلیکس گواتاری

## چەند تێڕامانێکی نووسەر

ڕووخسـار لـە سـەردەمی مۆدێرنیتـە و دوای-مۆدێرنیتـەدا، یەکێکـە لـە گرنگـترین ئەنـدام و پێکهاتـەکانی جەستەی مرۆڤێک. کە توانیویەتی کاریگـەریی ڕاسـتەوخۆ و ناڕاستەوخۆی لەسەر جیهـانبینی و هەڵسـوکەوتمان دابـنێت. بـە درێـژایی مـێژوو، گـرنگی ڕووخسـار بـە بـەردەوامی ناسـێنراوە و بـەرچاو کـەوتووە. بۆوێنـە: ئایکۆنۆگرافیـای ئـاییني و، پۆرترەیتـەکانی سـەردەمی ڕێنەیسـانس و. دەرکەوتنی تەلەفیزیۆنەکان لە سەردەمی مۆدێرندا و پاشـان دەرکەوتنی تۆڕە-کۆمەڵایەتییە سەرهێڵییەکان لە ئێستادا.

بەها بەباوداندراوەکانی سـەردەمی مۆدێرنیتـە و دوای-مۆدێرنیتە، ڕووخساری لە لـەپی دەسـتێکەوە کـرد بـە پانتاییەکی ملیار مـەتری. ڕووخسـار چیدیکـە وەک هێمایـەک

یان نیشانەیەک نەمایەوە. بەڵکو وەکوو خاکێکی سەربەخۆ هەژموون و ئیرادەی خۆی چەسپاند بەسەر مرۆڤایەتیدا. ڕووخسار لە چوارچێوەیەک ساکارەوە گۆڕا بە خاکێک کە خاوەنی شووناس و ئاڵا و ناوچە و دەسەڵاتی تایبەت بەخۆیەتی.

بیجگە لە ژیانی ڕۆژانە، ڕووخسار، بە درێژایی وێستگە مێژووییەکان، سەرچاوەیەک بووە بۆ هونەرمەندان و هونەر بە گشتی. ڕووخساری مرۆڤ بابەتێکی ناوەندی بووە بۆ زۆرێک لە فۆرمەکانی هونەر. لە کۆنەوە تا سەردەمی مۆدێرن. ڕووخسار وەکوو مەنزڵگایەکی سەرەکی بەکار هاتووە بۆ دەربڕین و ورووژاندنی هەستەکان و گێڕانەوە چیرۆکەکان. بەڵام لە ئێستادا بۆ یەکەمجارە لە مێژوودا، ڕووخسار وەکوو ئامرازێکی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی بەکار دێت.

ڕووخسارەکان کەسایتییەکانمان درووست دەکەن. بێجگەلەوەی ئەوان خاوەنی مۆرکێکی ئێستاتیکایین، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوان خاوەنی پانتاییەکی ڕامیاریی و جوگرافیایی قووڵن. بەتایبەتتر ئەم دیاردەیە ئەوسا تۆغتر دەبێتەوە کاتێک بەها باوەکانی کۆمەڵگایەک جەخت لەسەر هەمان بەهای باوی ڕووخسارەکان دەکەنەوە. بۆوێنە، بۆ کەلتووری ئەلف؛ سپی-پاتی جێگای سەرنجە. بۆ کەلتووری بێ؛ ڕەش-پێست جێگای سەرنجە. [١]

لە کۆمەڵگادا ڕووخسارەکان بەناڕاستەوخۆیی لەناو پۆلێنبەندییەکی قووڵی دەسەڵات و هێزدان. بەشێک لە ڕووخسارەکان لە بەشیکی دیکە کەمتر بەها و حیسابیان لەبۆ دادەندرێت. وە بەشێکی دیکەش بە پێچەوانەوە بە بەرز ڕادەگیرێن. ئەم پۆلێنکارییەش دەگەڕێتەوە سەر بەها

باوەکـانی کۆمەڵگایـەک لـەپای جوانیـدا. بـەڵام ئەگـەرچی ڕوونکردنەوەی زانسـتی بـوونی هەیـە بـۆ دەستنیشـانکردنی جوانی, بۆوێنە: دموچاوێکی ڕێک و ئەندازەیی و بیرکارییانە ... بەڵام مەرج نییـە لـە هـەموو کەلتوورێکدا ئەمـە بـاو بێت. وە هەروەکوو لە ڕابردوو و تەنانەت ئێستاش، لە بەشێک لە کەلتوورەکاندا قەڵەوی بەهایەکی جوانە. بەڵام مەرج نییـە لـە ڕووی ئەنـدازەیی و ماتماتیکییـەوە، جوانییـەکی تـەواوەتی و بابەتی بێت ...

بـەڵام لـە هـەمان کاتیشـدا دەکـرێت ڕووخسـار وەکـوو چـەکێک بـەکار بهێنـدرێت و تەنانـەت ئیسـتیغلالیش بکـرێت. بـۆ بەشـێک لـەو تاکانـەی کـە لـەناو دۆخێکی ناهەمواردان؛ کاتێک چاوەکان ڕووبەڕووی چـاوێکی دیکـە و جەسـتەیەکی دیکـە دەبنـەوە، ئـەوا چاوەکـان بەدواگـەڕان دەکـەن بـۆ هـەر پانتاییـەکی لاواز کـە لـەناو بەرامبەرەکـەدا

بـــوونی هـــەبێت. خـــودی داگیکـــردنی لاوازییەتـــەکان و ناسـکییەکان، سـوود لـە ئەندامـەکانی جەسـتە و بەتایبـەتتر ڕووخســـــار، وەردەگـــرێت بـــۆ پەخشـــکردنی ویســـــتە سەررڕێژییەکانی خۆی.

وردە-بەرکەوتنـــــەکانی ژیـــــانی ڕۆژانـــــە و، بەرکەوتـە دەموچاوییـەکان کۆمـەڵێک دەرکەوتـەی نـەرێنی پێـــک دەهێنن. پاشـــــانیش ڕێکیـــــان دەخـــــەن. وە ئـــــەم ڕێکخستنەوەیەش دەبخشنەوە بە خودی ڕووخسـارەکانەوە. لـێرەدا پرسـی شـاردنەوەی دەموچاوەکـان دەبێتـە جێگـەی پرسیار ...

ئەوەندە زۆربینینی ڕووخسارەکان وای لـە ئێمـە کردووە، خودی کردە و چـالاکی بینیـنی ڕووخسـارەکان بـە کەشـــێکی ئاســـایی وەبگـــرین. بـــەڵام لەڕاســـتیدا لـــەکاتی

بەرکـــەوتنی دوو ڕووخســـاردا، یـــاخود کاتێـــک کـــە ڕووخسارێک، ئەوەیەکی دیکە دەبینێت؛ ئەوا لـێرەدا دۆخێکی جیـاواز ڕوو دەدات. لــێرەدا دوو بــوون دەکەونــە نـاو چوارچێوەیەکی ناسینەکی و گەمەی هێزەکانەوە.

هەڵســـوکەوتی هۆمۆســـاپیانەکان لەگـــەڵ ڕووخســـارە ناســـراوەکاندا جیـاوازە لەگــەڵ ڕووخســـارە نەناســـراوەکاندا. ئــەوان لەگــەڵ ڕووخســـارە ناســـراوەکاندا زیاتر کراوەترن. کراوەتر بەو مانایەی کە دەتوانن ئەوە بڵێن و بکەن کە دەیانەوێت لە بەرامبەر ڕووخسارە ناسراوەکەدا. بـەڵام لـە بەرامبـەر ڕووخسـارێکی نەناسـراودا، ئـەم ئەرکـە بۆیـــان زەحمـــەتتر دەبێت. ئـــەم یاســـایە دەشـــێت بـــۆ هەستپێکردن بـە هـەر بـوونێکی نەناسـراویش ڕاسـت بێت. بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ڕووخسـار خـاوەنی هەسـتپێکردنێکی جیاوازە، ئەم یاسایە زیاتر بەسـەر ڕووخساردا دەشـکێتەوە

وەک لەوەی جەستەیەک بێت.

مەزنـدە بکـەن ئەگـەر تاکێـک ئاشـنای کـەمترین ڕووخسار بێت، لـێرەدا ئـەم تاکـە لـەناو کـەمترین پەیوەنـدی کۆمەڵایەتیدایە. وە تۆڕەکەی ئەوەندە بـەرین نییـە. بـەڵام بـە هـۆی بینیـنی ڕووخسـاری زیـاتر، ئـەم تاکـە دەکەوێتـە نـاو پەیوەندی کۆمەڵایەتی زیـاترەوە. کـە ڕەنگـە بەشـێکی زۆری ئـەم پەیوەندییانـە پێویسـتیش نـەبن. لـێرەدا خوێندنەوەیـەکی ڕەخنەگرانە لەپای بینین و ئاڵوودەبوونی بەردەوامی تاک بە ڕووخسـار پێویسـتە ... گرینگـە خوێندنەوەیـەکی ڕەخنەگرانەمان هەبێت سەبارەت بەم دیاردەیە.

لـە ئێسـتادا ئەوەنـدە گـرینگی بـە ڕووخسـار دەدرێت کـە لـە ڕادە بـەدەرە و لـە دۆخی ئاسـایی خـۆی دەرچووە. ئێستا ڕووخسار بووە بە کاڵایـەکی ئـابووری. وە

مامەڵە-ئەندامییەکان و گواستنەوەی سیمبوولە ئابووریی و بەها کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگەی ڕووخسارەوەیە. بە پێچەوانەی ئەو تیۆرانینە باوەی کە گوایە جەستە زیاتر داواکاری لەسەرە لەناو پانتایی مامەڵە-ئەندامییەکاندا، بەڵام لەناو واقیعدا، ئەوەندەی مامەڵەی-ئەندامی بە دەموچاوەکان دەکرێت بە جەستە ناکرێت؛ تەنانەت جەستە وەلا نراوە و گرینگ نییە. هەروەکوو لە گوتەیەکی کۆنی کوردیدا دەگوترێت: جوانی هەموو درۆیە شەرتی چاو و برۆیە. لێرەدا ڕووخسار سەنتەرە.

لێرەدا ئێمە بەناچارەکی دەکەوینە ناو پرسیارێکەوە: ئایە ئێمە وەکوو کۆمەڵگایەک و بەتایبەتی کۆمەڵگا و جڤاکی کوردی، هیچمان کردووە هەتاوەکوو ڕووخسارەکانمان بپارێزین لە هەر جڵەوێکی ئیستیغلالکارانە و پێشێلکردن؟ ...

به تێڕوانینی خۆم وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە سـەخت دەبێت. چونکـە هۆشـیارییەکی وەهـا بـوونی نییـە لـەپای ڕووخسـار و گرینگییـەتی ڕووخسـار لـە کۆمـەڵگادا. ئێمە ڕۆژانە تەنها لەناو کـاڵا ئابوورییـەکانی ڕووخسـارداین و هەر ئەوەنـدە. بـەڵام هیچ بیرکردنەوەیـەک و تێگەیشـتنێک بەرهەم ناهێنین لەپای ئەم پرسەدا.

هـەروەکوو باسـمان کـرد، ڕووخسـار خـاوەنی دەسـەڵاتێکی داگیرکارانەیـە. ئایـە پێویسـتە چی بکـرێت بـۆ ئەوەی خۆمان لە داگیرکـاری-ڕووخسـارەکی بپـارێزین؟ ... لێرەدا ئێمـە دەکەوینـە نـاو پرسـیارێکی ئـەخلاقی و ئاکـاری سـەبارەت بـەم پرسـە. هەڵبەتـە بـە پـێی ئـەنجامی توێژینەوەکـەمان، وا پێویسـت دەکـات کـە ڕەهەنـدە ئاکارییەکەی ڕووخسار بخەینـە ڕوو. چونکـە بـە ڕای ئێمـە،

ئەمە گرینگترین ڕەهەندە لەم باسەدا. لە کۆتاییدا هەموو شیکردنەوەکان دەچنەوە سەر پرسیکی ئاکاری و، ئەم بابەتەش لەم بیرۆکەیە بەدەر نییە.

لەنێوان دووانەی [٢] ڕووخسار و کەسایەتیدا، دەستبەسەرداگرتنی پانتاییە کۆمەڵایەتییەکان زۆربەی کات لە ڕێگای ڕووخسارەوە دەبێت. بەڵام ئەمە ماوەیەکی کاتییە. ئایە ماوە کاتییەکە چەندە؟ ... لە تەمەنی پیریدا. [٣]

لە ئێستادا هەر بڕیاردانێکی سەرەتایی و کتوپڕ، دەبێتە زیانگەیاندن بە کۆمەڵێک ڕەهەندی کۆمەڵایەتی ژیانمان. لەبەر ئەوە، ئەگەرچی دەزانین کەوا مۆدێلی باوی ڕووخساری ئێستا شیاو نییە، لە هەمان کاتدا نابێت هەوڵی بڕیاردانی پەڕگیر و توند بدەین لەسەر ئەوەی کە ئاخۆ چی جۆرێک لە مۆدێل و شێواز باشترینە بۆ ڕووخسارێک لە کۆمەڵگادا ...

فەلسەفەکاری بریتییە لە درووستکردنی چەمکەکان. نەک تەنها بۆ ناسینەوەیان، بەڵکو بۆ داهێنانیان.

– ژیل دۆلۆز (Gilles Deleuze)

# دوا وتە

ڕووخسار پرسێکی کۆمەڵایەتی و فەلسەفییە. کە لە ئێستادا پێویستە هەڵوەستەیەکی لەسەر بکەین و خوێندنەوەیەکی ڕەخنەییمان بۆی هەبێت.

بە گشتی، لێکۆڵینەوە لە ڕووخسار، بوارێکی دەوڵەمەند و ئاڵۆزە. کە بەردەوام لە پەرەسەندن و فراوانبووندایە. بە قووڵکردنەوەی تێگەیشتنمان لە ڕێگاکانی بنیاتنانەوە و لێکدانەوە و بەکارهێنانی ڕووخسارەکان لە چوارچێوە کۆمەڵایەتی و فەلسەفییەکاندا، دەتوانین تێڕوانینێکی نوێ لە سروشتی پەیوەندییەکانی مرۆڤ و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی لە پای ڕووخسار بەدەست بهێنین.

له کۆتاییدا ئـەوە بـۆ خوێنـەر بـەجێ دەهێڵم کـە هەمیشە بە تێڕوانینێکی بیرکردنەوەیی و ڕەخنەیی، ڕەچاوی ئـەم پرسـانە بکـات. وە هـەموو وێنەدانەوەیـەکی کۆمـەڵگا و شوێنە باوەکان مـەرج نییـە ڕاسـت بن و حەقیقـەت-سـەنتەر بن. بـەڵکوو بـە پێچەوانـەوە: لـە ڕاسـتیدا لـە ئێسـتادا ئـەوەی ڕاستییە بریتییە لەوەی کـەوا بەشـێکی زۆری ئـەو تشـتانەی کـە ئاشـناین پێیـان، لـە ڕاسـتیدا سـاختەن و هیچ بـوونێکی حەقیقەتی و ڕاستەقینەیان نییە. ڕووخساریش لەم قەیرانـەدا بێبەش نییە.

ئەرکی فەلسەفە وەڵامدانەوە نییە، بەڵوو پرسیارکردنە بۆ بنیاتنانی ڕێگەی نوێی بیرکردنەوە.

- فیلێکس گواتاری

# سەرچاوە و پەڕاوێزەکان

دەروازە :

[١] Looksmaxxing :

هەوڵێکە تیایدا تاکێک دەیەوێت شێوەی بگۆڕێت بۆ ئەوەی جوانییەکەی بگات بە بەها جوانە باوەکانی هاوسەردەمەکەی. ئینجا ئەم شێوە-گۆڕینە لە دانانی ڕیش و سمێڵ بێت یاخود نەشتەرگەریکردن و کردەی بەرچاوی دیکە.



[٢] Symptom :

بریتییە لە نیشانە سەرەتاییەکانی نەخۆشییەک یاخود پەتایەک. — لەبۆ نموونە: یەکێک لە نیشانەکانی نەخۆشی شەکرە، برینی پێیەکانە.



ژیل دۆلۆز و فیلێکس گواتاری :

[1] Gilles Deleuze, Félix Guattari – A Thousand Plateaus: Capitalism and Schizophrenia – Translated by: Brian Massumi – University of Minnesota Press – 1980 – Page: 184

[2] Ibid, Page 167

[3] Ibid, Page 180

[4] Ibid, Page 181

شیکردنەوەی زیاتر :

[1] Input :



[2] Semiotic Systems :

هەر سیستەمێک کە بەرپرس بێت لە بەیەکەوە لکاندنی کۆمەڵێک وێنە و دەنگ بە کۆمەڵێک بیرۆکەوە. وەکوو: هێماکانی ترافیک. ئیمۆجییەکانی سەرهێڵ، وە لۆگۆ و براندە جیهانییەکان.




[3] لەبۆ خوێندنـەوەی زیـاتر و شـیکردنەوەی زیـاتر؛ تکایـە بڕوانە:

Punished Felix : Notes, 2022-12-31 - what is facilality?

[4] ئیســـــــــتیغلالکردنی ئێســـــــــــتاتیکایی [Aesthetic Exploitation]

ئیســــــــتغلالکردنی جوانیناســـــــــی یـــــــاخود ئیســـــتیغلالکردنی سەرنجڕاکێشـــییەت [ Attractiveness Exploitation] ئاماژەیــە بــەو کردەیــەی بــە بــەکارهێنانی هێمــا کولتوورییــەکان، جوانیناســـی، یــان زانیــنی نــەریتی کۆمەڵێک کەس بەبێ ڕەزامەندی یـان دانپێـدانانی درووسـت ئیستیغلال دەکات. (بڕوانە سەرچاوە و پەڕاوێزەکانی پرسی دواتر بۆ شیکردنەوەی زیاتری ئەم چەمکە).

چەند تێڕامانێکی نووسەر :

[١] لـێرەدا ئێمــە خوێندنەوەیــەکی گشــتگیر ئــەنجام دەدەین. ئەگـەرچی ئـەم یاسـایە دەکـرێت لـە تاکێکـەوە بـۆ

تاکێکی دیکە بگۆڕێت و ڕێژەییە نەوەکوو ڕەها بێت.

[٢] دوالــــــــیزم (Dualism) ، دایکۆتــــــــۆمی (Dichotomy).




[٣] بـۆ خوێندنـەوە و بەڵگـەی زیـاتر سـەبارەت بـە پرسی تەمەن و سەرنجڕاکێشیەتی ڕووخسار، تکایە بڕواننە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

Oshin Vartanian, Vinod Goel, Elaine Lam, Maryanne L. Fisher, Josipa Granic – Middle Temporal Gyrus Encodes Individual

Differences in Perceived Facial Attractiveness – February 2013 – American Psychological Association

–

Alley, Thomas R. “The Developmental Stability of Facial Attractiveness: New Longitudinal Data and a Review.” Merrill–Palmer Quarterly, vol. 39, no. 2, 1993, pp. 265–78.

–

Said, Christopher P., and Alexander Todorov. “A Statistical Model of Facial Attractiveness.” Psychological Science, vol. 22, no. 9, 2011, pp. 1183–90

–

Little, A. C., Jones, B. C., & DeBruine, L. M. (2011). Facial attractiveness: evolutionary based research. Philosophical Transactions: Biological Sciences, 366(1571), pp. 1638–1659.

پارادۆکس، پاسۆس یان سۆزی فەلسەفەیە.

- ژیل دۆلۆز (Gilles Deleuze)

جەختکردنەوەمان لەسەر پرسی ڕووخسار، پابەندە بە هەبوونی ئەو دەسەڵاتە کۆمەڵایەتی و فرەڕەهەندەی کە ڕووخسارێك هەیەتی لە کۆمەڵگا و جڤاکێکدا. ڕووخسار هەر تەنها بەشێکی فیزیکی سەر ڕووی جەستەیەکی مرۆڤ نییە. بەڵکوو خاوەنی چەندین چین و توێژی ڕامیاری و کۆمەڵایەتییە. ئەم جەختکردنەوەیەی مرۆڤایەتی لەسەر ڕووخسار، لە هەموو کاتێك زیاتر تۆخ بووە ...

